کەڵـەگا مێـژووی گوڵـە پـەراوێزکراوەکانی نێـو باخـچە سـەوزەکانی روانینمانـە. مێـژووی ئـەو مرۆڤانەیـە وەک رستەپیـشۆکـو هەڵـەکۆک دەکران بەگەردنی مردنەوە.

مـن دەمـەوێ بـاس لـە عـەوداڵێ ئینـسان بکـەم کاتـێ بـە شـوێن جوانیەکانـدا سـەر هەڵـدەگرێ. ئـەو دەمانـە چـۆن دەتوانـێ مـەرگ لەسەر لەپی دەستەکانی خۆی هەڵگرێ. من دەمەوێ ئازارەکان خۆیان گەواهی بدەن، نەک ئەوانەی بە قەڵەمە زێڕینەکانیان مێژوو دەکەن بـەو چـەپکە گوڵـە نـازدارەی خۆیـان بـە دەسـتی ئـارەزوو لـەم وێرانـە خاکەدا دەیچێنن. رەنگـە شیعر بـە تـەنها هـەر لـە چێنگە سەوزەکانی سۆزدا نەڕوێ. شیعر هەندێ جار کەوتنەخوارەوەی کەرتـە شاخێکە لـە کونجێکی دوورەدەستو پەراوێزکراوی سەرزەمیندا. بـەڵام تـا ئەبـەد لە گوێی مرۆڤایەتیدا دەزرینگێتەوە.

شیعر هـەر بـاس لـە مـەرگ ناکـا کاتـێ دەسـت لـە دەسـتو پەنجـە زبرەکانی قـەدەر دەدا، شیعر بـە تـەنها چـەمی هـاژە کـردووی گریانـێ نییە کاتێ دەرگای گۆرستانەکان ئاوەڵان.

شیعر هەمیشە سەمایەکی شێتانەیە، کـە بـاڵی فـڕین دەدا بـە خـەیاڵ، نووسینەوەی ئەو نامانەیە لە خەیاڵی عاشقێکدا، کە ناتوانێ بە پەیڤین دەریببڕێ. شیعر تەنها سوپەرێکی قووڵە بەرگری لەو عەشقە نەمرانـە دەکا، ئەگەر لە توێشووی رۆژانی داهاتووی دەربهێنن. مرۆڤایـەتی بـە

گشتی دەکەوێتە مەترسییەکی روحیی گەورەوە، چونکە شیعر کۆی ئەو دەربڕینانەیە سەرەڕای جیاوازی زمانو کەلتوورەکان دەتوانێ هەموو مرۆڤایەتی بدوێنێ.

دەبوایە شیعر لە بریی ژماردنی گۆڕە بەکۆمەڵەکان، لە بریی هەڵواسینی وێنەی هاورێ دزراوەکان، لە بریی پۆلە ژنو کچە ئەتککراوەکان، لە گوڵە رەنگاو رەنگو دەگمەنەکانی باخچەی جوانی بدوایە.

بەڵام کاتێ کەڵەگاکان، ئەوانەی مەزراو شیعرو دارستانو کانیو جوانی پێشێل دەکەنو دژ بە عەشق جەنگی درێژخایەن بەرپا دەکەن، دنیا دەکەن بە بارووتو چەپە دووکەڵ، ئیدی شیعر دەکەوێتە پاراوکردنی گوڵە رەنگاو رەنگەکانی جوانیو  هێز دەداتە بەر ئەژنۆی هەتاو بۆ توانەوەی شێرە بەفرینەکانی چەوسانەوەو کابووسەکانی سەر رۆحمان.

له هونەری کوشتار

فێری تۆڵەو تیرۆرو پرسە بووین

له هونەری خۆشەویستیش

قەبرستانێکی ئاوەدان.

**ئەو دەمانەی بە ئاشکرا**

**جەلادەکانمان راموسیو بە نهێنیش**

**سروودمان وت بۆ نیشتمان،**

**رۆژانێ بوو،**

**بە هەدوو دەست چەپڵەمان بۆ**

**جەنگاوەرەکان لێئەداو**

**چڵەنێرگزی روانینمان**

**بەپێخەی سەرکردەکانی جەنگەوە هەڵدەواسی**

**قومێ ئاومان نەدا بەو شەهیدانەی**

**لە سەرەمەرگدا**

**چنگێ خۆڵیان لە مشتدا بوو.**

**بەر لەوەی بە کەساسی رەوانەی بەهەشتی مەرگ بکرێن،**

**سەرو ریشیان**

**لەبەر بریقەی تفەنگـو ئاوێنەی دڵە شکاوەکانی ئێمە سپی**

**کرد.**

**کەچی ئەوان**

**پیاوانی سەر چڵەپۆپەکانی روانینمان**

**ئەوانەی لەسەر هەوری خەیاڵەکانمان دەنوستن**

**بۆ بوارێکی تەنکتر**

**لە چەمەکانی خوێنمان**

**تا قولەپێ قاچیان هەڵدەکرد..**

**تا.. بۆ نووسینەوەی کەشکۆڵی بیرەوەرییان**

**هەریەکەیان پایتەختی وڵاتێ بکا بە نیشتمان.**

**هەموو ڕێگاکان بە ڕۆمای چارەنووسی مندا دەڕۆن**

**نیرۆن لەسەر دوو ڕێیانو لە کەناری ڕێگە وەستاوە!**

**کەللەسەری ڕۆژانی مێژووی خوێناویم دەداتە دەست!؟**

**دەبێ بڕۆم..**

**هەرچی زووە.**

**زام بە زامی ئەم جەستەیەم**

**بە سویَ بێنم**

**لەگەڵ دەمی چەقۆکان‌و لوورەلووری گەلە گورگی بەخوێن**

**تینووم خۆم رابێنم**

**خۆم بهاومە دێراوی ئەو رۆژانەوە،**

**کە باوکم**

**بە گڵمتکی درشت**

**ئاوی بەختەوەریی تیا**

**قەتیس دەکرد**

**لە پلوسکی چاوانیڕا**

**لەو ئەستێرکە سەوزانەوە**

**بە خوڕ فرمێسکی دادەکرد**

**بە دیار لاوکـو حەیرانی سەربەهەش‌و مل بە کوێنەوە**

**دەگریا..!**

ئێمەش بە پێی پەتیو بە چاوی پڕ ئەندێشەی منداڵیمان
بەرامبەر بەو فرمێسکانە
چین چین دیواری خەیاڵمان
هەڵدەچنیو
سەری سوڕماومان رادەما

هەرچی زووە
دەبێ بە شوێن
فرمێسکی رێچکەکردووی چاوەکانم‌و زەنگۆڵە عارەقەی
شەکەتیمدا

**بگەڕیم..**

**تا دەگەمە تارماییەکانی خەیاڵمو بگەڕێمەوە بەر**

**دەرگا کڵۆمدراوەکانی منداڵیم**

**ئا لەوێدا.. لەسەر لاپاڵی غەمگینی چیای ئەزمڕو قەیواندا،**

**شوێنپێکانی وردە شووشەی بیرەوەرین!**

**دایکم دەیگووت:**

" - پێش لە دایکبوونی تۆ بە دە هەڵقرچانی هاوین،
بە دە دەسکەنەی پایزو پێش دەساڵ
لە خونچەی ژاکاوی تەمەنی تۆ
من بەو ڕێگاو بانانەوە کۆڵەخەمی
کۆچبەری خۆم دەبرد بۆ شار.

**جوانیی تەمەنی گەنجیی خۆمم**

**بە پشتی ئەم شاخانەوە دەگواستەوە..**

ببوم بە هاوڕێی کازیوە
تەڵەتیشکی بەیانیانم
لەگەڵ خۆمدا سەردەخستو
ئێوارانیش
خۆرنشینم دەدا بەکۆڵی حەسرەتدا.

به چاوی عەشق

دەمڕوانییە بوومەلێڵی گوندەکەمان

به دەستی رەنج سڵاوم دەکرد لە رێبوار."

دایکم دەیگوت:

" -ئەوسا بڵێسەی تۆڵەو رق
هێند باڵایان نەکردبوو
چەمی هەڵچووی خوێن
روانینی یەکجار وا دانەپۆشیبوو
خۆشەویستیش دەیتوانی
بەسەر بەردەبازی ئێرەو ئەوێی
رووباری مەرگدا باز بدا..

مێردەزمەی برسێتی،
لە کەناری جۆگەلەی کۆڵانەکاندا
وەک خاشاکی دوا تۆفـو گەرداو
بەگسکی بازوو

**دەماڵرا**

**ئەمساڵی بەردێ**

**لە پارو لە تارمایی ساڵانی زوو**

**سەوز تر بوو**

**رەشبەڵەکی ئەمساڵ**

**لە پار بە جۆشترو ئاگردانی ئەمساڵ**

**لە پار پڕ سکڵو گەرمتر بوو**

**هەر سەرەتا،**

**پێش ئەوەی عومرێ باڵق بێو**

**خەمێ خەتو خاڵ دەر بکا**

پەیکەرێکمان

لە دڵماندا بۆ هیوایەک هەڵدەکۆڵی‌و هەر بەو سۆزەش

جارێکی تر

دارو پەردووی هەرەسێکمان

سەریەک دەنا.

**تەمەنمان بە رۆشنایی تریفەو هەتاو دەپێوا**

**دڵمان بە گزنگی کوڵکە زێرینە رەنگ دەکرد**

**بە کلی سۆز**

**چاومان دەڕشتو زەمەنمان لە گیرفانی**

**خەمێکی بیرچوو هەڵدەگرت.**



**سواری کۆڵی حەسرەت دەبووین،**

**بە هەردوو دەست**

**یاریمان بە جەستە وردو درشتەکانی خەم دەکرد**

**ئەم گەرداوە لە کوێی گۆی زەویەوە هەڵدەکا.**

**کەس ناپرسێ...؟**

**دەرگا پۆڵایینەکانی نیگەرانی**

**دەرگای زیندانەکانی دڵ**

**دەرگای کارگە ئەتۆمەکان**

**کارگەی چەکی جەنگە درێژ خایەنەکان**

**ناودار ترو ناودارترو ناودارترن.**

**کەس ناپرسێ..؟**

**پیاوە زۆربڵێکانی بەر مایکرۆفۆن**

**بە بەهەشتی بەڵێنەکان بەدمەستترو بەدمەستترو**

**بەدمەسترن.**

کەس ناپرسێ..؟
ئیتر ئێمە گومانمان لە
وەڵامەکانمان پەیداکرد
بۆ سەرەتای ڕێیەکی تر

**بەشوێن پرسیارە غەوارەکاندا دەگەڕاین**
**لە دەرگای هەر دڵێکمان دا**
**لەپەنجەرەی هەر ماڵێکمان دا**
**لە سنووری داخراوی هەر سۆزێکمان دا**
**سەرسام وەک ئێمە دەیپرسی**
**لە منارەی هەموو مزگەوتەکانەوە**

لەژێر خاچی هەموو کڵێسەکانەوە
لەبڵنگۆی قەتارو ئەڵڵاوەیسیو
لە لاوکو حەیرانەوە
بە ئاشکرا بانگی سەرەتای شەڕێکی
وەرزەبەردینەی هەڵئەدا

# سەرەتای شەڕ

رۆژانێ
پەڵە گەنمە بەهارییەکان
بە قەرسیلی دەکەوتنە بەر شاڵاوی رەوە کوللە
جوتیارەکان بە دیاریەوە پێدەکەنین و

داهۆڵەکانیان دەشکاند.

ئەو رۆژانە
سەرەتای خەزانی یەکەمین گەڵای بەختەوەری و
هەڵوەرینی پەڕەگوڵی هیواکان بوون
ئەو رۆژانە
کەپکە شاخیان بەسەر ئەوینی حەشاردراودا دەڕوخاند.

**بەم دەستەیان گوڵیان بە قەرەوڵی تفەنگەکان هەڵواسی**

**بەو دەستەیان نانی گەروی هەژارانیان دەڕفاند!**

**لە نێوان ئێمەو ئەواندا**

**وشە نەما**

**روانین نەما**

**ئەوین نەما**

لەو ساتەوە دیالۆکی مەرگ بووە گۆرانیی هەمووومان.

هەر سەرەتا قفڵە ژەنگاویەکانمان پەیدا کرد.

کلیلە ونبووەکانمان دۆزییەوە

نیگەرانیمان سەوزەبوو

**تاکو دەهات دوودڵیمان باڵای دەکرد**
**دەستی راستمان گومانی لە دەستی چەپ‌و**
**چاوی چەپمان گومانی لە چاوی راست‌و**
**پێیەکانمان لە یەکتری‌و**
**روانینیشمان گومانی لە بیستن دەکرد.**

**ئەو ڕەنگانەی من یەکەمجار لە چاوی ئاگردا بینیم**

**هێشتا پەلکەزێڕینە لە چاوی خۆری نەدزیوە**

**ئەو هانایەی من لە قوڕگی منداڵانی دێیەکەمان دیم**

**هێشتا غوربەت بە گەرووی هیچ غەریبێکی نەچڕیوە.**

**گوندەکەمان**

**دەکەوتە نێوان**

**ئەفسانەی سەدەکانی نێوەڕاستو هەورە ئاڵۆزەکانی پایزی**

**عومری سەدەی بیست.**

**دێکەمان**

**ناوی تێکەڵ بەناوی نەخشە نەفرەتیەکانی زەمین بوو**

**بۆنی تێکەڵ بە بۆنی شانە خەمێکی هەنگوین بوو**

**وەکو پرچی کچە هەمیشە یاخیەکان**

**پاش دەسکەنەو هەڵپاچینی**

**دەیان بینی باڵا دەکات‌و هەڵدەچێ**

**جارێکی تر**

**دەکەوتنە هەرەسی دارو دیوار**

**رنینەوەی بسکە کورت‌و درێژەکانی باخچەی دێ**

**وەک راهاتنی منداڵێ**

**بە داگرتنی ئەستێرەو راهاتنی پەلەوەرێ**

**بە پێکەنینی جریوە**

راهاتبووین

تاریکـو لێڵ

پێش زەنگی نوێژی بەیانی

لە ترسی هۆردووی داگیرکەر

لە ترسی دالاشی عەسکەر

چاوی گومانمان بە ئاسۆی
سەرەو خواری گوندی خەواڵو دەڕوانی
گوێمان دەنا بە چریکەی باڵی فڕینی
ئەو مەلانەی هەمیشە لانە تەریو بوون
سەرمان دەنا بە دیواری سەرنجەوە

دڵنیایمان دەکوشت و چاوی ڕێشکەو پێشکەمان دەگێڕا

لەنێوانی تارمایی گوندو

تارمایی ئەفسانەی مەرگدا

چونکە زۆرجار

پێش سەڵای بانگی بەیانی

پێش خوێندنی کەڵەشێری لە خەو یاخی

**بەر لەوەی گوند چاوانی بە شەونم بشوا**
**زۆر جار مەرگیان ئالآنبووە خەوی شیرینی ئەم گوندەو**
**ماڵ بەماڵیان کردبووە وێرانەخاک**
**چەقۆی پەنجەیان خستبووە پرچی رەزو**
**دەمی ژەهراویان نابووە قوڵپی پێکەنینی کانی.**

# زێـــــد

ئەم نیشتمانە چەند بچووکە
مەلێ ناتوانی بیکاتە مەڵبەندی فڕین.

**ئەو چاوانە چەند بەرینن،**

**کەچی دەبن بە زیندانی ئەوین**

**ئەو زێدەی من**

**چەند ئەستێرە لەسەر سنگی ژوانێکی دەکەوتنە قاقاو**

**پێکەنین**

چەند چەپکە تریفە

لە دەنوکی پۆلە مەلی کۆچەریەوە

بەسەر سەریا هەڵدەوەرین؟!

نازانم...نا

**وەلێ دەزانم هەر هێندەی چۆلەکەیەک**

**لە نێو مشتی منداڵێکدا هەڵبلەرزێ**

**دەکەوتە سەوداو پەلەپەل،**

**کە دەیبینی بلدۆزەرێ**

**کۆڵانێکی خاپور دەکاو تفەنگێ**

**بزەی سەر لێوی سەر هەتا پا گوند دەکوژێ**

**ئەو رۆژانە بەسەر چوون.**

**وەک هەر رۆژێکی ئاسایی**

**بەڵام لە شوێن هەر چرکەیەک,**

**هەر ساتی هەر کازیوەیەک**

**یادگارێکیان بە جێهێشت،**

**هەندێکیان نەناسرێنەوە**

- وەکو قریشکەی ژنان‌و
ترسی چاوی منداڵان‌و
وەک هەڵپڕوکانی درەخت‌و
هەڵلەرزینی گەورە کچ‌و
بە کوڵ گریانی پیرەگوند

**هەندێکیان ناوترێن وەکو**

**- بڕینی مەمکی دایکێ**

**لە پێش چاوی ساوایەکدا**

**وەک کەوتنی کەرتەشیەک.**

**- گرێدانی پرچی شۆڕی پۆلەکچێ**

**بە پاشکۆی زرێپۆشەوە**

- تف بارانی نێوچەوانی داپیرەیەک لەبەردەمی
دارستانێ ساڵی پیرو پەککەوتەدا
- باڵی هەڵوەدای پەلەوەر لەترسی شالاّوی ئاگر
ئەو رۆژانە لەچی دەچوون
نازانم..نا

- کچانی دێ دەستو پەنجەو نێوچەوانیان
لە خەڵووزانی پڕ سکڵو دارو پەردووی گوندی سووتاو
سواخ دەدا
هەر ئەوانیش
دوکەڵی قەترانی رەنجی باوکو براو باپیرانیان
لە گۆی مەمکو روومەتە سوورهەڵگەڕاوەکانیان هەڵدەسوو



پڕ بە عەرشی خودای ئەرزو

پڕ بە عەرشی خوای ئاسمان‌و

کتێبە پیرۆزەکانی ئێرەو ئەوێ

دەیانپرسی:

" -ئەرێ توخوا پەنجەی تاوان گەیشتە کێ؟

ئەرێ ماڵی دڵی کێی تر تالآن کرا؟

داوێنی کراسی کرِنەکی کێو

مێخەکبەندی گەردنی کێو

ئەڵقەی بووکێنیی کێ دزرا؟"

**چەند ئەستەم بوو**

**فرمێسکی قۆپەنێ گوڵو گورزە دڕکێ**

**تێکەڵ دەبوون**

**چۆلەکەیەک باڵی نوقمی دووکەڵی گوندی سووتاو بوو**

**بە قەترەی شەونمی گەڵا**

**خۆی لە پۆلە چۆلەکەی میوانو پۆلە چۆلەکەی کۆچەری**

**هەڵدەقورتانو**

**وەک ئەوان**

**بە نێو دووکەڵی پێچخواردووی گوندی سووتاودا هەڵدەفڕی.**

**چەند ستەمە**

**دەبینی وا سەری بڕاوی کۆرپەکەت**

**وا لە چنگی ئارەزووی پیاوکوژێکدا**

**ئێستاکە نا**

**ساتێکی تر**

**دەیداتە بەر نووکی خەنجەر**

**دەیداتە بەر لێزمەی جنێو**

**تۆ دەبینی دەستو پەنجەی چەتەوڵێ**

ئەڵقەی پەنجەی هاوسەرەکەت داگیر دەکا

چەند ستەمە

بیرکەرەوە

دایکم‌و قەیرە کچانی گوندەکەم

باوکم‌و پیرەمێردە ریش سپیەکان

براکەم‌و منداڵانی پێ خاوسی گوندەکەم

هەر یەک بە جیا تفەنگێ پاسەوانیان بێ

بە بەرچاوی هەمووانەوە

- پوولەکەی سەر کراسە بووکێنیەکەی دایکم

هەڵوەرێنن

- مێخەکبەندی رستە کێویلەی عارەقەی کچانی دێ
لە گەردنا بپسێنن
- خەنجەرەکەی باوکم بدزن
- باوەڵی خەونە بچکۆلەکانی براکەم هەڵگرن
هەر هەمووشمان چاومان لێ بێ
کۆڵان بەکۆڵان گیان دەداو یەک بە یەکیش
دایک و باوکانی حەپەساو
نێڵە نێڵ جەرگیان دەسووتێ.

**ئەوە نیشتمانەکەی منە**

**ئەو کۆتەرە سووتماکانەی تۆ**

**ئێستاکە لە مۆزەخانەی پایتەختی وڵاتاندا دەیان بینی**

**ئەوە تاپۆی لێڕەوارو جەنگەڵە چڕەکانی منە**

**ئەو جەستانەی تۆ لە بەردەم ئەزموونگاکان دەیانبینی**

**ئەوە جەستەی دوا بۆردومانی دێیەکەم و پەنجەی قرتێنراوی منە**

ئەو پێمەڕو گۆچان‌و داس‌و تفەنگەی

لێیان نووسراوە دیرۆکیان

لە نێو مێژووا وون بووە

ئەوە بازووی ئاڵتونی دەست‌و مەچەکمە

گوێ بگرە

با تەوێڵی شاخ

سنگی شەقاری کێڵگەکان بێنە زمان

**بهێڵە با پیرەمێردی سەرو ریش سپی مێژوو**

**باسی منداڵیی خۆی بکا**

**پێش ئەوەی، کە یادگارە ژەنگاویەکان**

**حەسرەتکێشانە بدەنە قووڵپی گریان**

**ئەو دەربەندەی لە خەم سیخناخی ئێستاکە**

**لەم چەند دێرە غەمگینەدا**

**بە کۆڵانی ئەندێشەتدا گوزەر دەکا**

**هەر وا نەبوو..**

**رۆژانێکیش لەم دەڤەرە**

**چواروەرزەی ساڵ نێرگزەجاڕی خەیاڵ بوو**

**روومەتی جوان**

**روومەتی پیر**

**بەبزەی شادییەک ئاڵ بوو**

زەردەخەنە

لەگەڵ یەکەم پاچو بێڵی سبەینانی جووتیاراندا دابەشدەکرا

گۆرانی بەسەر کراسی ئاودامانی هەموو وەرزەکانیساڵدا

دەگوترا

ئەو دەمانە

خەون هەبوو

خەونی زۆر جوان

**ئەو تاڤگەو جۆگەلە شینانەی لە کراسی ئاودامانی شۆڕەژن و کچانی لێو بەخەندەوە هاژەیان دەکرد..**

کەسێ جوامێرتر بوایە هەر بە قومێ

چاوی خەواڵووی دەشۆری و

لەو تاڤگەی سەماو جوانییە

دەستنوێژی گوناهی گەورەی عیشقێکی تازەی هەڵدەگرت.

**کێ دەیوێرا**

**دەروازەی ماڵ کڵۆم بکا**

**بۆ ئەو کۆستە بەسۆزانەی**

**کراسی پرسەی کۆستێکی نوێ لەبەر دەکا**

**خەون هەبوو**

**خەونی زۆر جوان**

**تا سەعاتێ**

**بەزمی شایی هەڵکشایە**

**ساڵێ زەمەن وەردەچەرخا**

**بە چاوی دڵ**

**بە گوێی ئاواز**

**تا رۆحی منداڵانەی خۆت نەدەبینی**

**عارەقەی لاملو تەوێڵ نەیدەشتی**

**لەم دێرو خانەقای گوندە**

**تۆبەت لە تۆڵە نەدەکرد**

**نەدەبووی بە پێکەنینێکی بەهەشتی**

**شیرینە وەک ئاوی کارێزی نیوەڕۆی**

**نێوەراستی مانگی پوشپەڕ...**

ئەو جیهانە بچکۆڵەیەی زمانی عەشقی تیا ڕژا
بە نەشئەیە ئەو یادگارە تاڵانەی گەورەیت بیر دەباتەوە
منداڵانە
بە بێ سنوور
عومرێکی پڕ خەم‌و حەسرەت بە کێش دەکا

**سەمای شێتانەی مەرگ لە نێو لەپی دەستەکانما**

**ئەو ساڵانەم دێنێتە بیر**

**پایز سەرپەڵەی بە ڕێژنەی تۆپباران دەدا**

قولەپێم نوقمی خوێن

چاوەکانم غەرقی گریان

گەورەو بچووک

پۆل پۆل بەرەو سێبەری مەرگەسات

بە شوێن ڕێچکەی خوێنی چۆڕاوگە کردوومدا

لە خەیاڵی ئاڵۆزکاوی گوند هەڵدەهات

-ئەو گوڵە ئەستێرانە
چین لەم شەوگارە قەترانیەدا
دەڵێی دانی مروارین
لە پێکەنینی زنجێکدا.
- گریانی بەکوڵی دایکم
بۆ لە قاقای پێکەنینی ئەو ئەفسەرە رەشتاڵەیەدا نوقم
بوو.

- **دەم‌و چاوی خوشکەکەم‌و کچە حەپەساوەکانی گوند**
**بۆ لە کاری وێنە کێشێکی ناشی دەچوون،**
**کاتێ بە پارچە رەژوویەک**
**سحری جوانیی تابلۆیەکی خۆی بسرێتەوە..!**

**ئەمانەو زۆر پرسیاری منداڵانەم لەگەڵ خۆمدا گەورە کرد**

**منی شاعیر**

**ئێستا**

**نە بە سیحری وشەکانم**

**نە بە تابلۆی هونەرمەندێ**

**نە بە مۆسیقای کەمانچەژەنێکی هاوڕێم**

**هەوری ئەو خەیاڵانەم بۆ کۆناکرێنەوە**

ئێوە گوێ بیستمبن‌و

منیش بە کوڵ داکەم‌وبباریێم

بەیانیەکی گەش‌و رووناک، ئاسمانێکی کپ‌و هێمن نوقمی کراسە ئاودامانە شینەکەی بوو، تازە درەختە پەل‌و پۆل شۆڕەکان چاویان بە شەونم شتبوو، چۆلەکەی سەر گوێسەبانە نزمەکانیش، مەست ببون بە سۆزی جریوە. هێشتا کانیە چاو قرژاڵیەکەی دێیەکەمان بۆنی سنگ‌و مەمکی کچان‌و عەتری پرچ‌و ئەگریجەی ژنانی لێ دەهات.. هالاوی خەمێکی تەنک بەسەر سیمای کانیە چاو قرژاڵیەکەوە رەنگی مەترسی گرتبوو! ئەو جۆرە مەترسیانەی مرۆڤ حەرامان دەکا لە بیستن، حەرامیان دەکا لە لەزەت. گەرچی ئەو رۆژانە خەو بینین هەبوو، خەو بینینی جوان.. ئەو خەونانەی، کە پەنجە ژەنگاویەکان دەرگایان بە نارەوا لەسەر دادەخستن، بەنارەوا قەڵەمی کولی میرزا کەوا شۆڕەکان لێکیان دەدایەوە، بەنارەوا بریاری مردنیان دەردەکرد، بەنارەوا تورە دەبوون‌و شووشەی دڵی خەڵکیان دەشکاند بەیانی بوو، هێشتا شەوگار لە دەسکەنەی پرچە رەش‌و شانە

نەکراوەکانی خۆی تەواو نەبوو بوو، هێشتا لە پەنجەرەی ماڵە سۆفیو خوداناسەکانەوە زرەی دەنکە تەسبیحەکان هەر دەگەیشتە گوێی رادێران. شەو هەر باوێشکی ئەو ساتانەی دەدا، رەنگە پەرییەک، نا ئینسانێک وەک ئەوەی جوانی بە قەڵەمی ئارەزووی خۆی نەخشی بکا، سێ جار هەتا ئانیشک بە پڕیشکی ئەو تاڤگە بچکۆلەیە قۆڵە سپیو ناسکەکانی خۆی دەشۆری. ئەو تاڤگەیەی لە پلووسکو لێوە باریکەکانیەوە دەرژانە نێو حەوزێکی پڕ لە سۆزو عەشقو پێکەنین وەک ختوورەی چەخماخەیەکی لە ناکاو یان باڵی خەندەیەک لەسەر لێو بنیشێتەوە، گوێچکەو چاوی پڕ لە هەستی ئەو ماسیانەی راگرتبوو، کە لەو حەوزە زیندانەدا ئازادییان بیر چووبووەوە کەوتە گێڕانەوەی خەونە ئەفسوونیەکانی ئەمشەوی خۆی تا ئەم دوا دێڕو دوا وشەی لە لێوی نەکەوتنە نێو حەوزی زیندانەوە، ماسیەکان هەموو رانەچڵەکین، کانیە چاو قرژاڵیەکە پڕ لە تێڕامان نەبووبوو پڕنەبووبوو لە حەزی ئەو چرپەو رازانەی ئەم کچە عاشقە دەیگێڕێتەوە ئەو بەیانیە هەست وای دەوت دارو بەردی سەر رێگە، مەلو مووری هەڵتروشکاوی لارێی دێ، تەنانەت

بێدەنگیی رانەمەڕ تاکو ئاسمانیش هەروەکو لە رووداوێکی دڵ تەزێن بڕوانێو نەزانێ چۆن رووبدا کەی رووبدا، بۆ رووبدا هەست وای دەگوت رەنگە ئەم بەیانییە خۆر درەنگ تیشک بەسەر ئادەمیو پەلەوەرو ئاژەڵو گیاو سەرانسەر زەمیندا دابەش بکا رەنگە شاخی هەمیشە بە ئاگا نووستبێ رەنگە شوانی مل لە نێو فەرەنجیی نوقمدا بێ خەبەر لە دنیای بەردەم بوومەلەرزەی هەواڵ باڵبەستکراودا منو ئەوانو هەمووومان وامان هەستدەکرد، چونکە لێفەی هەورێکی رەشباو، تەنک، بەلاّم هەر ئەوەندە نەبوو، بێتە زمانو بباری هەر ئەوەندە نەبوو، بە بروسکە دامانگرێ.

ئاوا بەم سیما غەمگینەیەوە سەرشاخە شانو بازوو کەڵەگەتو چەمی بە چریکە هەڵکردوو مەزرای گوندی کردبووە سێبەری خەمێکی زەبەلاح لە نێوانی بەتەمەنترین دار مازووی ژنانی دێو ناسکترین دارگێلاسی کچانی هەڵوەدادا دوو چاویلکەی روانین هەن، کە هەریەکە لەو نیگا پڕ حەسرەتانە دەبینێ، کە وەک کۆرپەیەکی لە ئامێزی دایک دزراو یاخود گەڕانەوەی غەریبێ تامەزرۆیانە چاوەڕێ بکاو عەودالاّنە بپرسێ ئەو چاوانە هەر کامیان ئەودیو

پەردەی بەدگومانی جوانیە ژاکاوکراوەکان دەبینن، کە لە نێو ئەم حەوزە شین پۆشەدا لە بەردەم ئەو هەنسکانەی کانیە چاو قرژاڵیەکە، کە هیچ کەسێ درکی پێ نەدەکرد لە کام لای زەویەوە بۆ سەمایەکی هەڵقوڵین لە مابەینی درزی مەمکی ئەو تاشە بەردانەوە هاتووە/ یان لە نێوان شانی سواوی ئەو شاخانەوە دزەی کردووە/ کە چاوەڕوانیی هەزاران ساڵ بە پێوە رایگرتوونو خەوی ئەبەدیی لێ خستوون کەوتنە گێڕانەوەی ئەو خەونانەی بەم سبەی ساڵحانە لەسەر بانیژەو بەردەم دەرگای چاوەڕوانیداو لە دەمی منداڵە باڵقو کچە داوێن بە گوناه سواخ دراوەکانەوەو لە دەمی ئاگرینی دارمازوو کەووتە بەتەمەنەکانەوە بیستبوویان ئیدی هەموو خەونەکانیان تێکەڵی بۆنی مێخەکو سنگی رووتی عەنبەرینی زیندەخەوی عاشقانەو کابووسی دوا خەوبینینیان بۆ یەکتر گێڕایەوە بە دەستە هەڵلەرزیوەکانی نێو خەیاڵی پڕ نیگەرانی بەردی زبری چارەنووسیان بە کێلی پیرۆزی خەونە جوانەمەرگو خەونە ئەزەلیەکانیانەوە دەنا هەر یەکەیان لە دڵە راچەنیوەکەی خۆیەوە بڕیاری خێری قەراردا وەک سەربڕینی کارژیلەیەک

لە شەوارەی منداڵێکی تازەزاوی گوند یەکێکی تر بەخشینی ماچە بە کوڕە عاشقی ئاوایی‌و یەکێکی تر ووردوخاشکردنی تاشەبەردی ئەو دڵەی هێند سەخت بوو ئەویندارى هەرگیز پیادا سەر نەدەکەوت تا لەوە دڵنیابن بەیانییەکی دی گمەی کۆترەکان دەبیستن/ تا دڵنیا بن لەوەی جارێکی تر قازو قوڵنگەکان بە ئاسمانی گوند تێپەر دەبن/ جارێکی تر چاویان بە سێبەری بزێوی کوڕە دڵدارو کچە عاشانی نێو شەوانی قەترانی گوند دەکەوێ یان کارەساتێکی دڵتەزێن وەک رەشەبایەکی ناوەخت لافاوێکی ناوەڕاستی وەرزە وشکەو برینگەکانی ساڵ یان گەردەلوولی خەمێکی قورس بەرێوەیە چونکە رەنگی هەڵبزرکاوی خەونەکان هیچ لێکدانەوەیەکی تری بە دەستەوە نەدەدا خەونەکان هەموو یەک قریشکە یەک موچرکە یەک خورپەی تیادا ئاشکرابوو، کە رەنگە بە مەزەنەی ئەو پیرەکەوتانە، هەر هیچ نەبێ هەموو شاباڵی فڕینەکان هەڵبوەرێن چاوی هەموو روانینەکان کوێراییان دابێ ئافاتێکی زۆر گەورەتر لەوەی نەوەکانی پێش ئێمە بیستبوویان لەوەی کوللەو سیک‌و رووس‌و مشکی چاوشین بە خەرمانی رەنجی ئەم نیشتمانە هەلاهەلایەی کردبوو ئەو

رۆژه، پێش ئەوەی گێڕانەوەی چیرۆکی خەونە کابووسیەکان کۆتایی بێ پێش ئەوەی مەلو مووری پێدەشتەکان لە چنگی پەلاماری دەعبا دڵنیایی پەیدا بکەن پێش ئەوەی جووتیارەکان دەستی ماندوو بخەنە بەر تیشکی زیوینی خۆر پیاوە ئەفسانەییەکانی ئاگر، ئامێردەکانی دنیای باروت، دنیای شەڕو داگیرکردن دنیای رقو تۆڵەی هزری پیاوە قەڵەمبەدەستەکانی دەستەڵات ئەوانەی دەیانویست بە مەرگی ئێمە ژیانی خۆیان نەمر بکەن، بە خوێنی ئێمە دەستنوێژ بگرن هاتن، وەک رەشەبا، وەک بوومەلەرزە، وەک تاعوون، هاتن.. هاتن وەک ئەو کارەساتانەی توانای مرۆڤ لە ئاستیدا دۆشدادەمێنێ، خەیاڵ لە ئاستیدا چۆک دادەدا. هاتن بە نێڵەنێڵ، سنگی پەرژینی گوندی خەواڵویان شکاند بە شاخە پۆڵاینەکانیانەوە سەریان بە دەرگای ماڵ بە ماڵەوە نا بە پەنجەی گڕ دەسرازەی بێشکەی ساواکانیان قرتاندو هەر بەو پەنجە نەفرەتیانە کەوتنە رنینەوەی پرچی هەموو مێینەکان هەر بەو پەنجە نەفرەتیانە کەوتنە دەسکەنەی برۆو سمێڵو ریشی قەترانیی گەنجانو ریشی سپیی کەڵە مێردان بە هەناسەی تۆڵە بە دەمی

لیکداچــــۆڕاویانەوە، بـــە دەســـتی ئاســـنین بـــە قامـــچیی بزماررێژیانـــەوە، بەســـەر بـــاڵای هـــەموو دار چـــنارەکاندا سەرکەوتن ملی شۆرابەی هەموو دار بیە باڵا چەماوەکانیان تەوق کرد، لەسەر بەرزترین لقی بە تەمەنترین داربەروو، بێ ئەوەی رووخسەت. لە چڵی، لە لقێکی کۆڵەوار وەر بگرن. سەرکەوتن‌و جارِی مەرگی گەورەو بچووک رەش‌و سپی مردووو زیندوو/ سەر هەتا پا گوندی تۆقیویان راگەیاند ئیدی روانین چیی باس بکا چۆن سەیر بکا، چۆن ببزوێ، بیستن چی بگێڕێتەوە، چۆن بیرەوەریی تارماییەکانی خودی مەرگ خۆیان وێنە بگرێ‌و داگیرکەرێ پێ نەزانێ کاتێ هۆردووی داگیرکەر جنێویان، وەک پشقلی پاشووی ئاژەڵان هەڵدەوەری‌و بێ ئەوەی کەس هیچ بە بیریدا گوزەر بکا دنیای دوای وێرانەخاک دواشەپۆلە شێتەکانی خوێن دوا بزربوونی دەیان کاکۆڵ لوولی گوند دوا پرچ بڕینی پۆلە مەلێ کچ‌و ژنانی هەڵوەدا هەموو سەرسام لەو دنیا ئاڵۆزکاوەیان دەڕوانی، کە رەنگە هیچ دڕندەیەک ئاوا پەلاماری رانەمەڕی گوندی نەدابێ، هیچ گەلەگورگێ بەم نەعرەتەیە چواردەوری باعەباعی بەرخێکی وێڵکەوتوویان

نـەدابێ شـاخ شـاهیدە، هـیچ هەژدیهایـەک ئـاوا بـە شـوێن زەڕنەقوتـەی پەلەوەرێکـدا نەگـەڕاون هـیچ تووڕەبـوونێکی سروشت، ئاوا پەلاماری بەیدەستەیی ئینسانی نەدابێ ئەوان تەنها ئەوان، بە خۆیان‌و دەم‌و چاو رەش داگەڕاوە کانیانەوە، بە خۆیان‌و هەموو ئەو ئایەتانەی لە سنگیاندا تۆمارکرابوون بە خۆیان‌و دوو دەستی جەهەنـەمی‌و دوو پێی ژەهراویانەوە بـاخ‌و دارو سـەوزایی‌و چـێنگەی شاخەکانیـشیان وشـک کـرد. ئیتر دوایی مەست بوون بە خوێن، مەسـت بـوون بـە قیـژەو هانــاو پاڕانــەوە گونــدیان وەکــو کــەلاکێکی بەردەســت، گەلـەگورگێ، رەوە بـەرازێکی برسـی بـەجێ هێـشت‌و هـەر هەموویان بە مارشی بژی هـەڵۆکانی عێراق.. بـژی نیشتمانی شارستانییە دێرینـەکان، بـژی برایـەتی بیابـان‌و شـاخ، گونـدی شــەڵاڵیان لــە خــوێن‌و لــە فرمێــسک‌و پارانــەوە تێکــەڵ گەردەلوولی تووڕەی تـەپ‌و تـۆزی زرێ پـۆش‌و نرکـەو ناڵـەی زیلـی کـەیل لـە پیـاوە کـڵاو سـوورەکان لـە پیـاوە رەنـگ جەهەنەمیەکانی تاوانکرد.

**ئەوێ گوندێ بوو**

**پڕ لە فرمێسکی دووکەڵو**

**تەیمان کراو بە گردۆڵکەی سەر بە برین**

**ئەو سنوورە**

هەر بەقەد روانینی چاوی منداڵێ

دووربوو لە شاری جەنجاڵو پۆپەشمینی تەم داپۆشراوەوە،

باڵی راستی
له نێو پێدەشتەکانی گۆیژەداو
باڵی چەپی
خستبووه سەر شانی راستی سلێمانی

بەڵام لەسەر
ملی قوتی
هەر گردۆڵکەو هەر ترۆپکی,

لەسەر شانی
هەر بەرزایی و هەر بستۆکێ
ریزێ شمشێری ژەهراوی
ریزێ تفەنگی لەسەر پێ
گوێی تووڕەییان هەڵخستبوو
چاوی تۆڵەیان دەیڕوانی.

منیش سەری
منداڵانەم هەڵدەبڕی
بە دوو کەلا شووشەی چاوە تۆقیوەکانم دەمڕوانی

تا ئەو پەڕی سێڵاوی چەمی روانینم
بەر لەوەی وشە
پریاسکەی کەللەسەرم
بکاتەوە

میلی تفەنگی لەسەرپێ
قاچی هەنگاوم دەبەستێو
ئاورِم لە دەسرِێژی ئێستا نا تاوێکی دی
خەڵکـو خوای دێم پێدەداتەوە

**سەربازێک:**

**" - هەر هەمووتان دەست هەڵبڕن."**

**یەکێکیتر:**

**" —سەر بخەنە ژێر سێبەری پۆستاڵەکانی پێمەوە**

**یەکێکی تر:**

**" -چاو ببڕنە پەلەپیتکەی ئەو تفەنگەی**

**کارگە ئاشتیخوازەکانی جیهان**

**بۆیان هێناوم بەدیاری**

**ئەو وای دەوت‌و هەموومان**

**نەفرەتمان لە پێکەنینی مەرگەکرد**

**کە ناتوانێ قووتمان بدا،**

**کە ناتوانێ باهۆزی مردن بهێنێ**

**تا ئەم هەمووگوڵەگەنم‌و**

**گوڵەجۆ رەنگ پەڕیوانە**

**دروێنەکاو هەڵوەرێنێ**

**گەیشتینە شار**

**بەنێو لنگی سەربازەدەم بە گوللەو**

**دەست بە قامچییەکانا  دەرباز بووین**

**بەنێو تەلی دڕکاویو ژەهری نوستوودا**

**بەنێو مەرگی بەدیار ئێمە هەڵتروشکاوا دەرباز بووین**

**ئیتر شار بووە مۆڵگەی ئێمەی ئاوارەو مۆڵگەی خەمە وردو**

**درشتەکان**

**شار بووە خەوبینینی تازەمان**

**بیرەوەریی بەدۆزەخو**

**شار نیشتمان**

**رۆژانە زەنگی بڵندگۆ**

**بەملاو ئەولای منارەکانی شارەوە**

**چاوی هاتووچۆی تەماشاو**

پەیامی تازەی فەرماندەی
مەرگ دەهاتە خوارەوە:
یەکەم: ـ لەنێوانی بوومەلێڵو
تەماشای گوڵەبەڕۆژەیەک بۆخۆر قەدەغەیە
کەسێ کلیلی دەرگای دڵو دەرگای ماڵەکەی هەڵگرێ

دووەم:- لەنێوان وڕکی ساوایەک بۆ قومێ شیر
تا زەردەخەنەی تێربوونی سواڵکەرێ بۆ
چرکەیەک بەختەوەری قەدەغەیە،
نیگای حەرام لە نیوەڕۆی سنگکراوەی
کۆڵان بکەن

سێیەم: ـ لەنێوانی مەرگێکو مەرگێکی تردا
مەرگێ هەیە
بە سوێ ترە
بۆ ئەوانەی دەست ناگرن
بە ئەڵقەڕێزو قفڵو لاشیپانیماڵیانەوە

ئەو وای دەوت
ئێمەش هەموو
تا ئەوپەری سنووری شار
ئەندێشەمان شوێن هاڕەی تانکەکان کەوتبوو
تا دەسڕێژێ دەیهێنایەنەوە سەر ئێستای

**ئەم ئەندێشە بەئازارە**

**ئەو وای دەوت**

**ئێمەیش خێرا**

**نامە یاساغەکانمان دەسووتاند**

**پەیکەری نێو خەونەکانمان حەشار دەدا**

**هەر بە پەلەش**

**چراکانمان دەکوژاندەوە**

**هەناسەمان قفڵ دەدا**

چاومان دەکردە دووربین لە درزی ئەو دیو دەرگای
تاقە ژووری حەپەساوی تارو مارا
ئەو ساڵانە
زەمەنی شاری ئەفسانەو
خەیاڵی باڵی فڕینو

ئێستا هاڕەی دەبابەکان

دەستڕێژی نێو خەونەکانم

تێکەڵ پێکەنینی دایکم بوو

ڕاچەنینی شەوانەمو

ئەو چیرۆکـو داستانو شیعرانەی دەیاننووسمو نووسیومن

لەبیرم دێ هاڕەی زنجیری زرێپۆش

لە قریشکەی هاوڕێکانما تێکەڵ دەبوون

کاتیٚ عەجوولیمان ئەیگریانین بۆلای یەکتر
تامەزرۆ بووین بۆ گێڕانەوەی نهێنیی
ئەو کابووسانەی بە لاماندا تێدەپەڕین
تا بەپەلە بۆلای دەم و بۆلای گوێچکەو
بۆبەر چاوی حەپەساوی یەکتر بچین

کەچی هەموو ئێوارانێ دایکمان
دوا غەڵبەغەڵبی سەربازو
هارەهاڕی دەبابەکان
وەک مریشکی کروشکەکردووی کولانە دەیانگرتین
لەسەر ساجێکی ژەنگاوی بەچەند کەڵە پشکۆیەک

**یەک یەک ترسیان دەرئەکردین.**

**ئێمە منالْ بووین دایکمان**

**ئێمە منالْ بووین باوکمان خوشکو**

**براو دراوسێکانمان دەیانگوت**

**ـ مندالْینە،کە**

**تۆپی خۆر، لە خۆرنشین خلبووەوە،**

**کە ئەستێرە تاک تاک کەوتنە چاوشارکێ لەگەڵتاندا**

**شەمشەمەکوێرە، تاریکیی کردە ماڵی روانینی خۆی**

**ئێوەش خەیالْ بپێچنەوە**

**بە دوو پێ نا،**

**بە چوار**

بە دە
بگەنە ماڵ،
چونکە گورگێ پەیدابووە،
چاوەکانی
سەرتاپا شار دەبینێ

دەنگی دەگاتە گشت شوێنێ
کەڵبەکانی تیژ
وەکو چەقۆن
بەدەستێکی گوڵی ژیان هەڵدەکەنێ و
بەدەستێکی درەختی مردن دەڕوێنێ

لەکۆڵانە ئەنگوستە چاوەکانی مەرگەوە هاتووە
کوڕی سەحرایەو دایکیشی
لە پایتەختدا لقێ زرە دارخورمایەکی گەورەیە
باوکی پاسەوانی گێژەڵووکەکانی سارایەو
لە ئاوی سوێری سەراب پەیدا بووە



**وا هاتووە هەموو رۆژێ**

**مەلا بانگدان پەلاماری چەند گوندێكی نوستوو بدا**

**دەڵێن ئەو گورگە كەڵبە درێژە**

**نیوەی ئینسانەو نیوەی گورگ**

**سیمای دەعبایەكی دزێو**

**پەلاماری: دووچنگی خوێناوی هەڵۆ**

**هەتا بڵێی كەتەو ورگن**

**دەستەكانی كورت وەك كەنغەر**

**چاو زیت وەك چاوی بایەقوش**

**توورە وەک سەگی نهێنگر**

**دەمپیس وەک بۆنی ئاوەڕۆ**

**ئەم گورگە کەڵبە درێژە**

**سوێندی خواردووە بە سەحرا**

**بە لمو سەرابو بە حوسەین**

**بە دارخورماو بە حوشتر خۆرەو بەهەموو**

**ئەوانەی لە دورگەو بیابانا دەڕوێن**

**- تا منداڵان پەیڤی دایکیان لەبیر نەکەن**

**دایکی شەهید بە هەردوو دەست**

**چەمۆڵە لە گڵکۆی کوڕە شاخنشینەکەی خۆی نەنێ**

**تا قاسپەی کەو لەبیر کوردو لەبیر شاخو لەبیر کەو خۆی**

**نەباتەوە**

**پێ لە لوتکەی شاخی یاخیو**

**دەست لە چۆڕاوگەی خوێنینی وڵاتی خاپور**

هەڵنەگرێو

بیر لە خەونی گەڕانەوە

بۆ بن سێبەری دارخورما

بۆ ژێر پێڵوی چاوی سەرۆکی فەرماندە

بۆ ئامێزی ژنە سۆزانیەکانی پایتەخت نەکاتەوە.

ئەم گورگە کەڵبە درێژە

چاوێکی کەلا بەردینەی گاشە بەردێکی کوێستانو

**چاوەکەی دیی بریسکەی شمشێری جەڕاح بوو**

**قاچێکی بەردی سەر ڕەوەزی شاخ**

**ئەوی دیکەی سامی عەجاجی باشوور بوو**

**دەستێکی کوڵەوژی تەنووری گوندی بنارو**

**ئەوی دیکەی ماری ژەهراویی سەحرا بوو**

**بە پەنجە نەوسنەکانی مەرگ**

**پەرژینی هانای دەشکاند**

به سەرنجی ئاگراویش
سنگی کراوەی بەزەیی‌و
چاوی ئومێدیی دەتۆقاند
ژمارەی ئەستێرە کوژراوەکان  هەر هەموویان
لەسەر شانی خوێناوی  زەرد دەچوونەوە

پێنجگۆشەی هەر ئەستێرەیەک
لە دەڤەرێکی خاپوورو

**پۆلە مەرگێکی لەبیرچووی**

**خەڵکـو خوا وورد دەبوونەوە.**

**(زەعیم سدیق) ناوێ بوو**

**وەکـ ژەهری مار تاڵ بوو**

**بروسکەیەکـ بوو لە مردن**

**وەکو دەعبای هەزار سەرو شەولەبان و**

**دێوی سپیو دێوی رەشو**

**جنۆکەی نێو تارماییەکانی کەلاوە.**

**لە شەوی ئەنگوستە چاوا**

**سامێ بوو بۆ چاوی گورەزۆکی ساوا.**

**زەعیم سدیق**

**نۆبەرەی سەدەیەک پیلانی نهێنیی**

**کۆشکو سەرا بە کەللەسەر هەڵچنراوەکانی بەغدا بوو**

**ئەو بەتەنها**

**کوڕی تاقانەی سارایەک**

**دەستگیرانی عەجاجو عاشقێکی خوێن خۆر نەبوو**

ئەو پەنجەرەیەکی کراوەی ئەفسانەکانی دنیا بوو
لە پەنجەکانی ئەوەوە
دەست دەخرایە دەستی مردن
ئەڵقە دەخرایە پەنجەی مەرگ
لە چاوەکانی ئەوەوە رەشەبای مردن هەڵیدەکرد

لە سیمای ئاگراویی ئەودا
بەغدا ئایندەی خۆی دەخوێندەوە
بە ئاشکرا

که گوڵەجۆیەکی گەرمیان

سەری دەنا بەسەری گوڵەگەنمێکی کوێستانەوەو

بە نهێنی لە سەر شانی گورزە تیشکێ

باسیان لە سەربەستی دەکرد.



دەستی راستی کانیە چاو قرژاڵییەکەیە، یاخود..؟
ـ نەخێر ئێرە جێ تەباری ئێوارەی خانەقای گوندە.
ـ ئەو پەڵە سووتماکەی
دەڵێی پارچە هەورێکی
رەشتتاڵەی ناوەڕاستی مانگی بۆنخۆشی گولانە
شوێن قوتابخانەی بە هەراو پێکەنینی منداڵانە

ئا لەوێدا من بە خەیاڵ
شوێنپێی منداڵانی پێخاوسی گوند دەبینم.
ـ ئەی کێ ناڵێ

**ئەوە سەرچاوەی**

**کارێزی**

**بەیانیانی**

**کچە عاشقەکانی گوند نییە؟**

**بەوەی منیش هەست دەکەم**

**چاوم هەڵدەفڕێو دڵم خێراتر لێدەدا**

**ـ نا**

**وا نییە**

**ئەم نیشتمانی سووتماکە**

**چاوەڕوانیت فریو دەداو خەیاڵ دەکوژێ**

**ئەم نیشتمانی خەرەندە**

**شەوانی زستانی درێژی**

**بە لرفەو ناڵەو نەعرەتە**

**بە چاوی پڕ لە ئەندێشەی چاوەڕوانی**

**سەیر دەکرێ.**

**رۆژانی گوڵرەنگی بەهار**

**بە خەیاڵی هەڵفڕینی پەپوولەوە گرێ دەدرێ**

**بۆیە درەختی عەشقی تۆو**

**عەشقی هەموو فەرهادەکان**

پێش ئەوەی چرۆ دەربکەن
دەبن بە سووتماکی ئەوین
بە تێکەڵاوبوونی وەرزەکان
هەر بە دەستە ئاسنینەکانی خۆمان
لە بێخەوە هەڵدەکێشرێن.

ساڵ کاروانچییەکی بزێو بوو
بەیانیان

قژی هەتاوی شانەنەكراوی
بەسەر زەمینا پەخش دەكرد
ئێوارانیش
بە دیار رەنگی پرتەقاڵیی ئەو تیشكەوە
تەسبیحی سێسەدو شەستو پێنج دەنكەی خۆی دەژماردو
پێدەكەنی

ئێمەش لەو كەرنەڤاڵە مەزنەدا
دەتریقاینەوە لەگەڵیو
بە پاچی پێكەنینیشمان

گۆڕێکمان بۆ ساڵێکی بەسەرچوومان هەڵدەکەنی

ڕۆژگار عەرەبانەیەکی سەنگین بوو

ئێمەی ئەسپو

ئێمەی سەگـو

ئێمەی تاژی

بێهودە ڕاماندەکێشا

بێئەوەی بزانین

ڕەنجی بازوومان کێ دەیخوا

بزانین بۆ ناگەین بەهیچ

بزانین ئەچین بەرەوکوێ

شەختە سەهۆڵەکانی رۆژگاریش

لە ژێرپێ تەزیوەکانمانەوە

رۆژ لە دوای رۆژ دەمانبینی

دەت

وێ

تە

وەو

بۆ

**ئەو سەردەمە**

**لە یادما بۆتە چەند وەرزێکی بەردین**

**بەشانی سیزیفێکی ترو**

**لەکێوی ساڵانێکی تردا**

**بەسەر رۆژو هەفتەو مانگ‌و**

**وەرزەکانمان خلدەبنەوە**

بەکوڵی پرمەینەتی خۆمان هەڵدەگرین
ئەوسا باوکم کوڵەوژێکی باریک بوو
لە تەنووری داخراوی ماڵی دڵمان
سکڵی کوژاوەی دەردێنا
وەک نامۆیەک چاوی بەهەر چوار لای شارا دەگێڕا
تا ئەو رۆژەی چاوی چاوەڕوانیی لێکنا

لە شەقامە سڕەکانی شارەکەما
بەو دەستو پێ تەزیوانەوە
رەنجیەداو پاڵی بە جەستەی شەکەتو رابردووی خۆیەوە
دەنا
لە نێوانی دوو بەرداشی بەخوێن هەسانکراوا

به شوێن تیکە نانی لە خەڵک‌و خوا بەجێماوا
دەڕۆیشت‌و تاکو ئێستەش بیرەوەریی ئەو خەمە یەکجار
گەورانە
لەو رۆژگارە تاریکانەدا
لە پێکەنین‌و گریانم
تەڵە تیشکێکی هەتاوە.



ئەو خەمانە هێند گەورەبوون

نایانناسمەوە

سەریان سپیو قەدو بالاّیان کۆماوەو چاوەکانیان کزو بێ

تینن

ئەوسا،

تێکەڵ ها..ڕ..ە..ی

زرێپۆشەکان دەبوون‌و لاقرتێیان

بە پێکەنینی زەعیم‌و بە گەڵی فشی سەربازو بە..

درۆی ئیستگەکانیان دەکرد،

کاتێ وەکو پەلاماری رەوە چەقەڵ

مریشکی نێو کولانەکانیان دەفڕاندو کورتانی کەری..

گوندەکانیان دەدزیو رەشمەی باگیرەکانیان دەخستە..
کۆڵەپشتەکانیانەوە!
ئێستگەکانیش
بە دەنگی بەرز
جاڕنامەی مافی مرۆڤیان دەخوێندەوەو
هەر لەوێشدا

سروودیان بۆ برایەتیی شمشێرەکەی دەستیانو گەلی برا..
بچووک دەگوت.
ئەو دەستانە

بە تەنها ماری حەوت سەری ساراکان،

عەجاجی هەڵکردووی بیابان نەبوون

هەر قامکێکیان

موستیلەی ئاڵتونیی

پادشایەکی عەرەبیو نقێمی هەر موستیلەیەک

ئاڵای شەکاوەی وڵاتێکی زڕبرا بوو

به تەنها کۆڵەوژی تەنووری هاوینانی پایتەخت نەبوون
لێرەش
دار بەڕوو هەبوو خۆی دەکرد بە
دارعەساوگۆچان

به قامچیی دەستی زەعیمو ئەو سەربازانەی میوان بوون

بۆ گرووني پێستي شاخو
سووتاندني گوندي برسیو
هەڵپاچيني قژی درێژی دارستان
هەر بە تەنها ئەوان نەبوون
من بە ساڵو مانگـو رۆژ
نازانم ئەو كۆتانە چەند لە دەستـو پێكانماندا بوون

وەلێ ئەوەندە دەزانم دەنگمان
بە گرياني خۆمانو گوێمان
بە زرەی زنجيرەكان راهاتبوون
ئەو دەمانە

**ئازادیمان نەبینیبوو**

**مێژووی ئەومان نەخوێدبۆوە**

**جوگرافیایمان نەدەناسی**

**مەگەر تەنها**

**بیابان خۆی بزانێ**

**هەڵوەدای دوا سەراب بەچی دەگاو بۆ کوێ دەڕوا**

*****

**تا دیواری گڵینی شار**

**دیواری بەفرینی لادێ**

نەبوونە ئەلبوومی کوژران

تا نازناوی شەهیدەکان

نەکرانە ناوی منداڵان

تا لووتکەی شاخ

نەکرانە گۆڕیچکەی ونو جۆگەلەکان



تێکەڵ نەبوون بە قەتارەی چەمی گریان
سەربەستی تەنیا حەرف بوو
حەرفی سڕو حەرفی خوارو خێچو ژاکاو
حەرفی بێگیان

ئەو وەرزانە هێندە نەبوون،

که منداڵێ ڕەنگی گوڵێ لە گوڵێکی تر جیاکاتەوە
ئەو وەرزانە هێندە نەبوون،
کە ژنێ تێیدا بە دڵ گۆرانی بەسەر جوانیی خۆیدا بڵێ
زۆر کورت بوون زۆر
ئەو وەرزانەی ئاشتی ڕۆژەکانی هەفتەی ناو دەنان

شەممە بۆ گەشتی فڕین بە ئاسمانی تەنیاییدا

**یەک شەممە بۆ گوێ گرتن لە مۆسیقای نهێنییەکانی سروشت**
**دوو شەممە بۆ  بیرکردنەوە لە ئەوین**
**سێ شەممە بۆ  رق هەڵگرتن لە تۆڵە**
**چوار شەممە بۆ گەڕان لە نێو دەریای قووڵی ئەندێشەداو**
**پێنج شەم بۆ حەقیقەت ئامێزگرتن‌و**
**هەینی  بۆ پشووی دوای شەشەمین رۆژی پێکەنین.**

نازانم

چەندبوو تەمەنی خەیاڵی باڵی فڕینم بە نێو

دوورگە ئاڵۆزەکانی مێژوودا

ئەوەندە نەبێ دەزانم

چوار وشکە ساڵ

ئێمە بێدەنگ بووین تا باسی سووتانی دارستان

لە زمانی شاخ خۆیەوە ببیستین

تا بەسەرهاتی کوژرانی

هەزاران ڕێبواری تینوو
لە زمانی کانیاو خۆیەوە ببیستین
هەر ئەوەندە
ئیتر گۆرانیی مردنمان
لە هەرکوێ یەک ببیسترایە
ڕۆژنامە زەردو سپییەکان مانشێتی مژدەیان دەدا
بە کۆنگرەی دەست بە تفەنگی ڕاوچیان

نیشتمان بووە کڵۆ خەڵوزێکی گەورە
هەریەکە بەقەد بیلبیلەی چاوی خۆی

**پارچەیەکی لێدەقرتان**

**تا پێش مردنی**

**ناونیشانو زەمەنی لەدایکبوونی خۆی پێ بنووسێ**

**نیشتمان بوو بە کامێرایەکی گەورە**

**تا هەر یەکە وێنەیەک بۆ**

**پۆستەرێکی پێش شەهیدبوونی خۆی بگرێ**

**لەگەڵ کۆچی پۆلە مەلی گەرمەسێردا**

**لە زیندانی پایتەختەوە**

پۆل پۆل مەلی دەنووکـو باڵکراوی کورد

بەرەو شاری گریاوو گوندی حەپەساو

دەهاتنەوە

لەگەڵ چەند پارچە شیعرێکی نێو گیرفانی جێماوا

شەقامەکان

بە نهێنی کران

بە ناوی شەهیدەکانەوە

کەچی هیچ کەس

نەیدەوێرا

بەو ناوەوە

**بە ئاشکرا**

**درەختێ بێنێتە وەلام**

**کۆلانەکان کران بە ناوی گوڵە هەڵوەریوەکانەوە**

**کەچی کەسێ**

**نەیدەوێرا**

**بۆن بە گوڵێکیانەوە بکا**

**ماڵەکان لە ئێسقانی پەنجەکانیان**

**یەکی خاچێکیان درووستکرد**

**کەس نەیوێرا بە دەرگاو دیواری ماڵێکەوە**

**هەڵیواسێ**

نیشتمان بووە دۆزەخێکی بەرین

هەموو نێچیری مردن بووین

جگە لەوان

ئەوانەی بە ئازارەکانمان پێدەکەنین

بە مەرگمان خەڵات دەکران

جگە لەوان

جگە لە داڵە کەرخۆرەی

ژێر کڵاوو جامانەکان

ژنەکان پێکەوە گریان

رووبارەکان پێکەوە وشکیان کرد

گوڵەکان پێکەوە هەڵوەرین

دارستانەکان پێکەوە سوتان

لە دامێنی شاخەکاندا

شاعیرەکان شیعریان لەسەر گۆڕی شەهیدەکان

دەنووسییەوە

لەو کاتەشدا

داڵی مردن

ژنی یاخیو شاخی یاخیو پیاوی یاخیو شیعری یاخیی

دەچنییەوە

**ئەو قەفەزە پۆلاییینەی**

**هەموومانی تیادا دەست بەسەرو یەخسیر کراین**

**هێندە نەبێ دەزانم**

**نێوان گوندێک و گوندێک**

**نێوان شارێک و شارێک**

**هێندەی ئارەزووی باڵلێکدانی پەپوولەیەک،**

**کە خەیاڵی فڕین دابێتی لەسەری**

**لە جریوەی بەیانیانی پاساریەک،**

**کە بیەوێ دارستانێ لە مەترسی رزگار بکا**

**هەر ئەوەندەی قامچیی مردن**

**بە گەردنی کەچمان بگا**

**رۆژە تاریکەکان رۆیشتن،**

**وەک رۆیشتنی هەژدیهایەک لە نێو باخێ گێلاسی سڤیلدا**

**رۆژە درێژەکان توانەوە**

**وەک توانەوەی کڵۆ ژەهرێ لە پێکی پیاوێکی مەستدا**

**گوڵاڵەی سەر گۆڕستانەکان پشکووتن**

**شەهیدەکان کراسە خوێناوییەکانی بەریان**

**دایە بەر خۆری ئازادی وشکبێتەوە پرسیان**

**ئێمە بۆ کوژراین؟**

**لەسەر چی؟**

**داڵە کەرخۆرەکانی بیابان کوشتیانین**

**یان برا خوێن خۆرەکانی خۆمان**

ئەرێ ژنەکانمان دەمانناسنەوە؟!
منداڵەکانمان ناومانیان بیر نەچۆتەوە؟
هاورێکانمان تەزبیح و سەعاتەکەی دەستمانیان
دایەوە دەستی پیرە دایکمان؟!
شاعیرەکان لەکاڵبوونەوەی شیعرەکانیان
لەسەر گۆڕە پیرەکانمان نیگەران نین؟

ئەمانەو زۆر پرسیاری تر
وەکو ئایا گوێتان لێبوو ئەستێرەیەک توورە بێ لە مردنمان
دار خورمایەک پرچی خۆی بڕنێ و بپرسێ بۆ؟

بیابانێ چریکەمان کۆکاتەوەو بیباتەوە بۆ کوردستان.
دەستێ لەگەڵ دەسترێژێکا شەبقەکەی سەری داگرێ.
قەڵەمێ لەم کەرنەڤاڵی مردنە بێتە زمان.
جارێکی تر ئازادی وەک ساحیرێ پەیدا بوو
سەرو گوڵێکی سووری دا لە ئێخەمان
دەرگا داخراوەکانی رۆحمانی کردەوە

دەستی پیرو منداڵە هەتیوەکانی گرت بۆ بەهەشت
پاش زەمەنێکی درێژ چاوەڕوانیی
پاش ئەوەی

**سورەتی ئەنفالیان لە کتێبە پیرۆزەکانەوە گواستەوە**
**بۆ هەردە هەردەی گەرمیان**
**لە کوێرە گوندەکانی ئەوێدا ئەزموونگای ژەهرەبایان**
**لەسەر مریشکـو کەوو منداڵە پێ خاوسەکانی دێ**
**هەڵاڵەی گوڵی دۆزەخیو**
**زەردەخەنەی مردنیان تاقیکردەوە**

**ئەو ساتە ئازادی رەنگی نەبوو وەکـ ئاو**
**گەرچی هەموو لە تینوواندا پاسەوانی سەراب بووین**

دەنگی نەبوو وەک مۆسیقا
گەرچی بە سحری جوانی ئەو گۆرانییەکی شەیدابووین
ئاخری ئازادی لە شەوێکی ئەنگوستەچاودا پەیدابوو
ئاخری ئازادیمان بینی بە کوڵێ خەیاڵی ڕەنگاوڕەنگەوە
پێش ئەوەی وەڵامی پرسیارەکانمان باتەوە
ئەو نامانەی خوێندینەوە، کە پێشتر بۆمان نووسیبوو

ئەو گۆرانیانەی گوێ لێگرت، کە بۆمان کردبوو بە دیاری
ئەو جۆگەلە خوێنانەی بینی،
کە لە هەوری ئازارەکانمانەوە داچۆڕابوون

بۆ ئەوەی قاچمان لە کێلی گۆڕە بە کۆمەڵەکانی رۆحمان هەڵنەکەوێ
بۆ ئەوەی رۆحمان لە هێڵنجی سەدەکان پاک بکەینەوە
دەستمان بە پاشکۆی شۆڕەسواری ئازادیەوە گرت
پێش ئەوەی ئەو
هیچ بڵێ ئێمە هەموومان
بە چەپڵەوە کردمان بە میوانی دڵمان

نووسەران مێزی کتێبخانەکانیان دایێ بنووسێ
بازرگانان قاسەکانیان کردەوە پیاسەی تیا بکا
منداڵەکان تۆپێکیان لە رەنگی ئازادی دروستکرد

ژنان مەمکانیان دایێ بیانکا بە مەدالیا
جووتیاران لە کێڵگەکاندا گوڵی ئازادییان رواند
سووڵتانەکانیش  بە دەستە نیگەرانییەکانیانەوە
کۆشکێکیان رازاندەوە تیا بنوێ
ئێستا پرسیاری شاخ لە دارستان
پرسیاری شەهید لە خاک
خاک لە ئینسان
ئەو پرسەیە

پرسیاری منیش
بە ناوی هەموو ئەوانەی لەم چیرۆکە غەمگینەدا

**شوێن پێی ئازارەکانیانم هەڵگرتووە**

**ئازادی کەی تورە دەبێ،**

**کە شاعیرێ جنێویدا؟،**

**کە سیاسییەک لە گوناهەکانی ژێوان بووەوە،**

**کە پۆلیسێ کەلەپچە هەڵواسراوەکەی کەمەری فڕێدا؟،**

**کە دەروازەی دادگاکان قفڵ دران؟،**

**کە توورە بوو تەقەڵ نادا لە زمانمان**

**مایکرۆفۆنێ سەکۆ ئازادەکانمان تێ ناگرێ؟**

لە خەونەکانماندا وەکو
زەعیمو جاش قەڵەمو جاش.. جاش.. جاش
نابنەوە بە کەڵەگا
ئایا ئازادی پیر دەبێ؟،
کە پیر بوو ناکەوێتە سووتاندنی نامە نهێنییەکانی نێوانمان؟
کاسێتی گۆرانییە غەمگینەکان ناشکێنێ؟

ناکەوێتە هەڵپاچینی شاباڵی خەونەکانی خۆی

**ئایا داری گوڵە هەناری ئازادی**

**جگە لەو پەیڤە سەوزو سوورانە**

**گوڵی رەنگاوڕەنگی ترو**

**بۆنی ترو**

**چڵو گەڵای خەیاڵیزۆر**

**دوورتر دەگرێ.؟**

***